# پەیامێکی دڵسۆزانە
# بۆ ئەو
# خوشکانەی باڵاپۆش نین



نوسینی

**بەنەیەک**

پێداچونەوەو و
پێشەکی نوسینی

أم سارا الكردية

١٤٤٤هـ

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى
ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ
ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ
ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا
مُّبِينًا ٣٦



پەیامێکی دڵسۆزانە بۆ

ئەو

خوشکانەی باڵاپۆش نین





**ناوی کتێب:** پەیامێکی دڵسۆزانە بۆ ئەو خوشکانەی باڵا پۆش نین

**دانەری کتێب:** بەندەیەک

**پێداچونەوە و پێشەکی بۆ نووسینی:** أم سارا الكردية

**ساڵی دانانی:** ١٤٤٤ هـ

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن
جَلَـٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٥٩




بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمد لله الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِيَ الملك

اشهد أن لا إله ألا الله وحده لا شريك له، هو الواحد الذي لا ضد له، وهو الصمد الذي لا منازع له، وهو الغني الذي لا حاجة له، وهو القوي الذي لا يعجزه شيء في الأرض ولا في السماء، وهو جبار السموات والأرض، فلا راد لحكمه ولا معقب لقضائه وأمره، هو الأول فلا شيء قبله، وهو الآخر فلا شيء بعده، وهو الظاهر فلا شيء فوقه، وهو الباطن فلا شيء دونه، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ .

وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، وصفيه من خلقه وخليله، أدى الرسالة، وبلغ الأمانة، ونصح الأمة، وكشف الله به الغمة عن هذه الأمة،.

اما بعد...

ئەم نامیلكەیە پێشكەشە بە هەموو ئافرەتێك كە لە پەراسوی پیاوان دروست بوون و جوانترین بەهەسترین بونەوەرن لەسەر زەوی، وە ئەم نامیلكەیە پەیامێكە بۆ تێگەیشتن لەسەر بالاپـۆشی






و ئەو دەقە گەورانەی کە هاتوون لە کەلامەکەی الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ و سونەتی رسول الله ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾.

وە پێشکەشە بە هەموو ئەو ئافرەتانەی کە هەتا ئێستا نەیان زانیوە واجباتی بالاپۆشی بە ئەمرکردن هاتووە لە لایەن پەروەردگارەوە ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾.

داوام لە الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ لە من و لە هەموو ئەو کەسانە قبوڵ بکات کە بە پیتێك بەژداریان کردوە بۆ دانانی ئەم نامیلکەیە وە یاخود دەیخوێنێتەوە و خۆی دەخاتە ژێر پەردەیەکی جوانی بالا پۆشی و ملکەچی هەموو ئەو ئەمرانە دەبێت کە الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ فەرمانی پێ کردوین لەوانە واجباتی بالاپۆشی ...






# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ کە دروستمانی کردوە بەڕاستی و بۆ ڕاستی و بۆ پەرستنی خۆی و بۆ جێبەجێ کردنی هەموو ئەو کارە چاکانەی پێمانی واجب کردوە و هەموو ئەو کارە خراپانەیش کە نەهی کردوە لەسەرمان.

سوپاس و ستایش بۆ الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ کە گەورەیی و ڕێز و حیشمەتی بە ئافرەتان بەخشیوە بە بالا پۆشی.

سوپاس و ستایش بۆ الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ کە ئافرەتانی بەرز نرخاندوە بە کەلامەکەی خۆی، بە فەرزکـــردنی بالاپۆشی و دوور بوونیان لە هەموو چاوێکی پیس و پاك راگرتنیان وەك گەوهەرێکی جوانی بنی دەریاکان.

لە دەسپێکـــی ئەم نامیلکەیە بۆ خوشکـــانی سەنگین و قەدر گران لە لای الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ بە داپۆشراوی و لەلای بەندەکانی بە بوونی حیشمەت و حەیا و شکۆمەندی و ڕێز، الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ بە کەلامەکەی خۆی ئەو ڕێزەی بەخشیوەتە ئـــافرەتان.



وەك اللە ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ﷻ بە ئافرەتانی رسول اللە ﷺ صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ﷺ دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ﴾ (سُورَةُ الأَحْزَابِ: ٥٣).:

کە لە ڕۆژگاری ئەو فەرمانە هاتووە بەسەر پاکترین ئافرەتانی سەر زەوی کە ئەوانیش خێزانەکانی رسول اللە ﷺ صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ﷺ بوون، کە رسول اللە ﷺ صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ﷺ و هاوەڵان بوون کە پێیان دەوترا باشترین سەردەم (خير القرون) ئەی ئەبێت لەم رۆژگارە چۆن بێت و چۆن بەو پلەیە بگات کە لەسەردەمێکی فتنە و فەسادی وەها کە هەموو هەوڵێك دەدرێ بۆ بەدڕەوشت کردنی ئافرەت و نەمانی زەمینەی ڕەوشت و حیشمەت لە کۆمەڵگای موسڵمانان بۆیە ئەی گەوهەرە سەنگینەکەم دەست بگرە بەو یاسایەی بۆت دابەزیوە لە ئاسمان لەلایەن دروستکارەکەتەوە کە اللە ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ﷻ یە .






# دەست پێك

ئەگەر پرسیار بکەی لەو کەسانەی کە بالاپۆش نین پێیان بلێین: ئەگەر شتێکی زۆر بەنرختان هەبێ و نرخی شتەکەیش زۆر گران بەها بێ ئایە لە شوێنێکی باش دەیپارێزن یان لە پێش چاوی خەڵکی دایدەنێن.

بێگومان وەلامیان ئەوە دەبێ دەڵێن: دەی پارێزین، وە لە شوێنی پارێزراویش دایدەنێین ئەی باشە بە نرخترین شتی ئافرەت شەرم و حەیاکەی نیە ، شەرم و حەیای ئافرەتیش کاتێك بەدی دێت کە لەگەڵیدا خۆیان داپۆشن و لاشەی خۆیان دەرنەخەن بۆ بێگانە.

لەوانەیە پرسیارێك بێتە پێشەوە بڵێن: زۆر کەسی بالاپۆشمان بینیوە شەرم و حەیایان نیە و خراپە دەکەن یان بە پێچەوانەوە دەڵێن: کەسی وا هەیە بالاپۆش نیە شەرم و حەیای هەیە و زۆریش بەڕێز و دڵی باشە، بۆ ئەم جۆرە قسانە نموونەیەك دەهێنینەوە دەڵێین: ئایە قوتابی و مامۆستا هەردووکیان تەواو کاری یەکتر نین ئەگەر مامۆستا نەبێ قوتابی دەتوانێ فێربێ یان ئەگەر قوتابی نەبێ مامۆستا دەتوانێ وانە بڵێتەوە زانستەکەی بگەیەنێتە خەڵکی، بێ گومان نەخێر هیچ کامیان بێ ئەوەی تریان نابێ،دەی کەوایە بالاپۆشی






و شەرم و حەیا هەردووکیان بەیەکەوە جوانن و تەواوکاری یەکترن.

ئایە بە هەموو تێڕوانینەکانت لەم ئیسلامەدا هەوڵ دەدەیت ووتەی خوت پێش بخەیت بەسەر ووتە و کەلامەکەی الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ ؟.

ئایە ئەو کەسانەی خۆیان دادەپۆشن دڵیان بۆ گەن و خراپە بۆیە خۆیان داپۆشیوە؟.

نا نەخێر ئەی ئافرەتی سەنگین ئەوان یاسا و دەستووری الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ جێ بەجێ دەکەن و دڵیشیان زۆر پاك و ڕێکە. وە نابێت بەو خۆ هەڵخەڵەتاندنە خۆت دوور بکەیتەوە لەم ئیسلامە و جێ بەجێ کردنی ئەو بەرنامانەی کە بۆت هاتووە.

زۆر بەڵگەی جوان و درووستمان هەیە بۆ ئەوەی تۆ بێ هیچ گومانێك ملکەچی بیت و بچیتە ژێڕ باڵی جیبەجێ کردنەوە.






# بەڵگەکانی قورئان

الله ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرموویێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ (سُورَةُ الأَحْزَابِ :٣٦).

**واتە:** بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی باوەڕدار ئەو مافە نیە کە هەر کاتێ خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە کارێکدا حوکمیان کرد، بۆ ئەوانیش لە کاری خۆیاندا ئیختیارێك هەبێ **(لە بەرامبەر فەرمانی خوادا)** وە هەر کەس نافەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات، جا بەڕاستی گومڕابووە بە گومڕاییەکی ئاشکرا.

کەواتە لەم ئایەتە بۆمان ڕوون بووە کە هەر فەرمانێك الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ پێمانی کردبێت نابێت ئێمە شوێن حەز و ئارەزووی خۆمان بکەوین.

الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرموویێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ (سُورَةُ الأَنفَالِ :٢٤).






**واتە:** ئەی بڕواداران وەڵامی خوا و پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە کاتێك بانگیان کردن بۆ هەر شتێك چونکە بانگەوازی خوا و پێغەمبەر ﷺ مایەی ژیانی ڕاستەقینەیە بۆ ئێوە. وە بەختەوەری ئێوە تەنها لەوەدایە.

الله ﷻ لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ﴾ (سُورَةُ البَقَرَةِ :٨٥).

**واتە:** ئایا چۆن ڕەوای هەقە باوەڕتان بە بەشێکی ئایەتەکان هەبێ و بە بەشێکی تری کافر بن و حاشای لێبکەن؟!.

ئەی خوشکەکەم کە تۆ باوەڕت بە نوێژ هەیە باوەڕت بە ڕۆژوو هەیە ئایا حیجابی شەرعیش فەرمانی الله ﷻ نیە بۆ ئافرەتان.

الله ﷻ لە ئایەتێکی تر دەفەرموێت: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ﴾ (سُورَةُ النُّورِ :٣١).

**واتە:** ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێ: بە ئافرەتە ئیماندارەکان، با چاویان بپارێزن لە سەیرکردنی پیاوی بێگانە، وە با






داوێنی خۆیان بەدوور بگرن لەبەد ڕەوشتی. وە جوانی و ڕازاوەیی و زینەتی خۆیان بەدەرنەخەن بۆ نامەحرەمەکانیان. وە با لەچك و سەرپۆش بەسەرو سنگیاندا بێتە خوارەوە.

پاشان الله تَبَارَكَ وَتَعَالَى دەفەرموویێت: ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ (سُورَةُ النُّورِ :٣١).

**واتە:** با لە کاتی ڕۆیشتنیاندا قاچیان نەدەن لە زەوی و تەق تەق بکەن بۆ ئەوەی بزانرێت چ زینەتێکیان شاردۆتەوە، ئەی ئیمانداران هەمووتان تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای تَبَارَكَ وَتَعَالَى چونکە ئەمە مایەی سەرفرازیتانە.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا الله تَبَارَكَ وَتَعَالَى دەفەرموویێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾﴾ (سُورَةُ الأَحْزَابِ :٥٩).

**واتە:** ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمان بدە بە خێزانەکانت و کچەکانت و خێزانی باوەڕدارانیش (چونکە خێزان و کچەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نزیك ترین کەسن لێیەوە ئەوان لە پێش ترن لە بەجێ گەیاندنی ئەم حوکمە) بەوەی کە






عاباكانیان بە سەریاندا بدەن، تا ئافرەتانی موسڵمان بە جل و بەرگەكانیانەوە بناسرێنەوە بەوەی كە بە حەیا و قورس و سەنگینن تاوەكو ئەزێت نەدرێن، وە خوای گەورە بەبەزەییە بەرامبەر ئەوانەی كە لەمەو پێش خۆیان نەپۆشیووە.

الله ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ﷻ لە ئایەتێكی تردا دەفەرموویێت: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ (سُورَةُ النَّحْلِ :٩٧).

**واتە:** هەر پیاو و ئافرەتێكی ئیماندار، وەڵامی داواكاری خوا و پێغەمبەر ﷺ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بدەنەوە و كردەوەی چاك بكەن ئەوە ئێمە (واتە الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ) دەیژیەنین بە ژیانێكی باش و چاك و پاك، وە پاداشتیشی دەدەینەوە بەگوێرەی چاكترینی كردەوەكانی.

خوای گەورە تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ لە ئایەتێكی تردا دەفەرموویێت: ﴿ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ ﴾ (سُورَةُ الأَحْزَابِ :٣٣).

**واتە:** (ئـەی ژنـانی پێغەمبەر! (هەر فەرمانێك بە خێزانەكانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كرابێـت ئەوا بۆ هەموو ئـافرەتـانی موسڵمانانیشە)) دەبێ ئێوە لە ماڵەكانی خۆتاندا بسرەون و ئۆقرە بگرن، (**واتە:** بێ كاری پێویســت لە ماڵ دەرنەچن)، نابێ ئێوە وەك






ســەردەمی جـاهیلیەتی زوو، زینەت و جوانی خۆتـان بۆ پیـاوان دەربخەن.

اللـه ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ لە ئـایەتێکی تردا دەفەرمووێـت: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾ (سُورَةُ الأَحْزَابِ :٥٣).

**واتە:** خۆ ئەگەر داوای شتێکتان لە ژنانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کرد، لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن، **واتە:** ئەدەب لە ماڵی پەیامبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و تێکەڵ نەبوون لەگەڵ خانەوادەکەیدا یاسایەکی خواییە و، دەبێ هەموو کات پێش چاو بگیرێ، ئا بەو شێوەیە پاکترە بۆ دڵی ئێوە و، دڵی ئەوانیش. (لێرەدا اللە تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ وەسفی حیجابی کردوە بە پاکێتی دڵی ئافرەتان و پیاوان (وەك قسەیەکی کوردەواری هەیە کە دەڵێت: هەتا چاو تەماشای نەکات دڵیش ئارەزووی ناکات)).






# بەڵگەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر بالاپۆشی

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:(صنفان من أهل النار لم أرهما بعد: قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات، مائلات مميلات رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة، لا يدخلن الجنة ولا يجدن ريحها، وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا )(صحيح مسلم).

**واتە:** دوو کۆمەڵ لە خەڵکی هەن لە دۆزەخ نەمبینیون: **کۆمەڵێکیان** قامچیان پێ یە وەك کلکی مانگا وایە پێی ئەدەن لە خەڵکی، وە **کۆمەڵەکەی** تریان ئافرەتانێکن جلیان لەبەردایە و ڕووتیشن، لە ڕێگە بە لەنجەو لار دەڕۆن تا سەرنجی پیاوان بۆلای خۆیان ڕابکێشن، قژیان ئەبەستن و کۆی دەکەنەوە لە سەر تەوقی سەریان وەك کۆپارەی ووشتر **(البخت)**ی لێ دەکەن، ئا ئەم ئافرەتانە ناچنە بەهەشتەوە و بۆنیشی ناکەن، لە گەڵ ئەوەی چەندەها ساڵ بۆنی دەڕوات.

ئەی ئافرەتی بەنرختر و گەوهەری دونیا تێڕامێنە بۆ ئەم فەرموودەیە، هەڕەشەیەکی ڕوون و ئاشکرای تیایە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە حیجابی شەرعی ناپۆشن یان جلیان لە بەردایە بەڵام






ڕووتن، واته یان جلەكانیان كورته و بەشێك لە ئەندامەكانی لەشی بەدەر دەكەوێت یان تەنكە و لاشەی دیارە یان تەسكە، یاخود پانتۆڵیان لەبەرە و لەچكێكیان بەسەرەوەیە، ئەم هەڕەشانە ڕاستین و دەكەویتە شوێنێك لە ڕۆژێكدا هیچ هیچ كەس بە هاناتەوە نایەت.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرمووێت:(لعن المتشبهين من الرجال بالنساء والمتشبهات من النساء بالرجال)((صحيح أبي داود ( ٤٠٩٨ )).

پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی كردووە لەو پیاوەی كە جلی ئافرەتان لەبەر دەكات ، وە لەو ئافرەتەی كە جلی پیاوان لەبەر دەكات.

یان لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرمووێت: (لعن الله الرجل يلبس لبسة المرأة والمرأة تلبس لبسة الرجل)( صحيح أنظر حيث رقم(٥٠٩٤) في صحيح الجامع).

**واته:** خوا نەفرەتی كردوو وە لەو پیاوەی كە بەرگی ئافرەت لەبەر دەكات، وە لەو ئافرەتەیش كە بەرگی پیاو لەبەر دەكات.

مەبەست لەم فەرموودانە: ئەگەر هەر جل و بەرگێك بۆ پیاو هاتبێ نابی ئافرەتان بیپۆشن. لەم سەردەمەدا بێگومان ئەم جۆرە ئافرەتانە زۆر زۆر بوونە بەداخەوە ئافرەتی وا هەیە لەچێك دەكات






مەگر بڵێ باشترین چاکەی ئەوەیە کە تەنها بەشی سەرەوەی داپۆشیوە ئەگینا بەشی خوارەوەی جل و بەرگەکانی زۆر دوورە لە حیجابی شەرعی ئەوەی مەرجی حیجابی شەرعی بێ تێیدا نیە.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (من أرضى الله بسخط الناس كفاه الله ومن أسخط الله برضا الناس وكله الله إلى الناس)(صحيح الترمذي للألباني ).

واتە: هەر کەسێك کۆشش بکات و هەوڵ بدات ڕازی بوونی خودا بەدەست بهێنێت بە تووڕەبوونی خەڵکی ( ئەگەرچی ئەو شتەی بەهۆیەوە خودا رازی بێت لێی، ببێتە هۆی ئەوەی خەڵکی لێی تووڕە بێت ) ئەوا خودا دەیپارێزێت لە تووڕەبوونی خەڵکی و خەڵکیش لێی ڕازی ئەبن، وە هەر کەسێك کۆشش بکات و هەوڵ بدات ڕازی بوونی خەڵکی بەدەست بهێنێت بە تووڕەبوونی خودا ( ئەوەی خودا پێی ناخۆشە بیکات، بەس بۆ ئەوەی خەڵکی لێی رازی بن ) ئەوا خودا دەیداتە دەست خەڵکی ( زاڵیان دەکات بەسەریدا وە لێی رازی نابن و خودایش لێی تووڕە دەبێت ).

ئەی خوشکەکەم تۆ ئەگەر لەبەر ئەوەی دایکت یان باوکت یان هاوسەرت یان هەر کەسێکی تر پێی ناخۆشە جلی حەیا و حیشمەت لەبەر بکەیت خۆت ناپۆشیت ئەوا دڵنیا بە الله ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَى وا دەکات هەموو ئەو کەسانەیش بە جل و بەرگە سفورەکەت ڕازی نەبن.






**ئەوەیە ئافرەتی بە حەیا و حیشمەت:** (عن ابن عمر قال : قال رسول الله ﷺ: (من جر ثوبه من الخيلاء لم ينظر الله إليه) ، قالت أم سلمة : يا رسول الله فكيف تصنع النساء بذيولهن ؟ قال : ((ترخينه شبرا)) ، قالت : إذا تنكشف أقدامهن ، قال : (ترخينه ذراعا لا تزدن عليه) ) (صحيح سنن النسائي رقم : (٥٣٣٦)) .

واتە: لە کوڕی عمرەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هەرکەسێك جلەکانی شۆڕکاتەوە بە مەبەستی فیز زلی و لە خۆبایی بوونەوە ئەوا خوا ـ ئەوەندە لـێی ناڕازی یە ـ سەیری ناکات ، (أم سلمة) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا باشە ئەی ئافرەتان چی بکەن بە پالێمەکانیان ؟ فەرمووی : یەك بیست شۆڕی دەکەنەوە ، وتی : کەواتە پێکانیان دەردەکەوێت ، فەرمووی : یەك باڵ شۆڕی دەکەنەوە و لەوە زیاتری ناکەن) .

چەند ئافرەتێك دەچنە ماڵی دایە عائیشە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا دایکی بڕواداران، کە پۆشاکێکی تەنکیان لەبەردایە دایە عائیشەیش رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا پێیان دەفەرمووێت: (إن كنتن مؤمنات، فليس هذا بلباس الؤمنات، وإن كنتن غير مؤمنات فتمتعن به...) (معالم السنن (٣٧٦/٤))

**واتە:** ئەگەر ئێوە ئافرەتی بڕوادارن ئەم پۆشاکە پۆشاکی ئافرەتی بڕوادار نیە، جا ئەگەر ئێوەیش بڕوادار نین، ئەوا لەبەری کەن و پێی ڕابوێرن.



ئافرەتێکی تازە بووك چووە لای دایە عائیشە رضي الله عنها کە سەرپۆشێکی (قبطی) ڕەنگاو ڕەنگی پۆشیبو، دایە عائیشەیش رضي الله عنها پێ فەرموو: **(لم تؤمن بسورة النور امراة تلبس هذا)**( تفسير القرطبي (١٤/٢٤٤)).

**واتە:** ئەو ئافرەتەی ئەم جۆرە سەرپۆشە بپۆشێ بڕوای بە سورەتی نور نیە.






# مەرجەكانی بالاپۆشی شەرعی

١- دەبێ سەرتاپای جەستە داپۆشێت.

وەك اللە ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرمووێت: ﴿وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ﴾ (سُورَةُ النُّورِ :٣١).

**واتە**: گۆشەی سەرپۆش و لە چكەكانیان بدەن بەسەر سینگیشیاندا تا گەردن و سینگ و بەرۆكیان دەرنەكەوێ).

بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا لەچكەكانی سەریان بۆ مۆدیلات و جوانكردنیەتی نەوەك داپۆشینی یاخود هەر لەسەریان ناكەن.

٢- نابێت هیچ جوانكارییەكی تێدا بكرێت كە جێگای سەرنج بێت.

٣- نابێت بۆ زینەت و جوانی بێت نابێت بۆ خۆبادان بێت ئەبێ بۆ خوا بێت.

٤- دەبێت ئەستوور و فراوان بێت تەسك نەبێت كە شێوەی جەستە دەربخات. (چونكە بەر ئەم فەرموودەی رسول اللە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ دەكەوێت: وەك باسمان كرد كە دەفەرمووێت:







(ونساء كاسيات عاريات، مائلات مميلات رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة)).

٥- نابێت لە پۆشاکی پیاوان بچێت. (چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لعن المتشبهين من الرجال بالنساء والمتشبهات من النساء بالرجال).

٦- نابێت لە جل و بەرگی کافران بچێت. (چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من تشبه بقوم فهو منهم) هەر کەسێك خۆی بە قەومێك بچوێنێت ئەوا لەوانە).

٧- نابێت بۆ شۆرەت بێت بۆ کەشخەی و بۆ تەکەبوور بێ. (پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من لبس ثوب شهرة في الدنيا ألبسه الله ثوب مذلة يوم القيامة ثم ألهب فيه نارا) هەر کەسێك جل و بەرگی شۆرەت لەبەر بکات خوای پەروەردگار تبارك وتعالى هەمان جلی لەبەر دەکات و ئاگر تێ بەردەدات لە ڕۆژی قیامەتدا).

٨- نابێت بۆندار بێت. (بۆن بۆ ئافرەتان حەرامە پیاوی نامەحرەم بۆنی بکات).






# وەڵامی گومانی خوشکانی سفور

گومانی یەکەم: هەندێکیان کە دەم دەکەنەوە کە گوایە باڵا پۆشی بۆ ئافرەتان نە گونجاوە لەبەر ئەوەی جوانیان دەشارێتەوە.

لە وەڵامی ئەم جۆرە قسانە ئەڵێین: ئەی خوشکەکەم ئەی بانگەشەی ئەوە ناکەیت کە موسڵمانیت ئەی ناڵێیت ئاینەکەم ئیسلامە و کتێبەکەم قورئانە و پێغەمبەرەکەم محمدە ﷺ، باشە بە کێ دەوترێت موسڵمان بۆ هەر کەس هات وتی من موسڵمانم بە موسڵمانان حیساب دەکرێت ئەی باشە موسڵمان مانی گوێڕایەڵیەکی تەواو بۆ خوای پەروەرگار ناگەیەنێت

ئەی الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ نەی فەرمووە: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ (سُورَةُ الأَحْزَابِ :٣٦).

**واتە:** بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی باوەڕدار ئەو مافە نیە کە هەر کاتێ خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە کارێکدا حوکمیان کرد، بۆ ئەوانیش لە کاری خۆیاندا ئیختیارێك هەبێ **(لە بەرامبەر**



**فەرمانی خوادا)** وە هەر کەس نافەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات، جا بەڕاستی گومڕابووە بە گومڕاییەکی ئاشکرا.

باشە حیجابیش الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ لەسەر ئافرەتانی فەرز نەکردوە ئەی کە ئەڵێیت موسڵمانم نابێ لە ژێر گوێڕای الله کەدا بیت ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ نابێ ئەو فەرمانانە کە لە کتێبەکەتدا هاتووە کە قورئانە و پێغەمبەرکەت بۆی هێناویت نابێ جێ بەجێ بکەین؟.

**گومانی دووەم:** هەندێك دەڵێن: گرینگ دڵمانە من دڵم پاکە با بالاپۆشیش نەبم دڵیش مەرجە بۆ چاکە.

بۆ وەڵامی ئەم خوشکانە ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﴿صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ دەهێنینەوە کە دەفەرمووێت: **(هیچ کەسێك نیە ئەم ئاینە بەچاکی بگرێت مەگەر هەموو لایەکانی بگرێت)** ئەی خوشکەکەم خۆ پێغەمبەر ﴿صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ نەیوتەوە ئەگەر تۆ دڵت پاکە گرینگ نیە **سەربۆش** بکەیت، وەك پێغەمبەر ﴿صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: (ألا وإن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله، وإذا فسدت فسد الجسد كله، ألا وهي القلب) (رواه البخاري ومسلم).

واتە: پارچە گۆشتێك هەیە لە لاشەدا ئەگەر ئەو چاك بوو هەموو لاشەیش چاك دەبێ، ئەگەر ئەو خراپ بوو هەموو لاشەیش




خراپ دەبێ، ئەویش دڵە) ئەگەر تۆ بەدەم بڵێت: دڵی من باشە و زۆر بە بەزییە بەرامبەر بە خەڵکی ئایە هیچ کەس دڵی تۆ ئەبینێت کە چی تێدایە ئەگەر بە کردەوە نەی کەیت، تۆ دەڵێیت: دڵی من باشە ئەگەر دڵت باش بووایە ئەوا ئەم فەرمایشتانەی رسول الله ی ﷺ وەردەگرت ئەم قسانە تەنها بۆ خۆهەڵخەڵاتانە و گوێڕایەڵی بوونی شەیتانە.

**گومانی سێیەم**: یان دەڵێن: چەندین بالاپۆش دەناسین چەندین شتی خراپ دەکەن منیش نامەوێت ببم بە بالاپۆش وەك ئەوانم لێ بێت.

ئەی خوشکەکەم خۆت مەخەڵەتێنە بەم قسانە ئایە هەر ئافرەتێك کە بالاپۆش بوو کاری خراپی کرد ئیتر ئێمە نابێت بالاپۆش بین تاوەك ئەوانمان لێ نەیەت، ئەی ئەگەر تۆ خوشکێکی بالاپۆش دەبینیت کە خراپەی کردوە، خۆ تۆ دەبینیت دەیەها و سەدەها و هەزارەها ئافرەتی سفور و رووت کـــاری بەدڕەوشتی و خراپەیی دەکەن بۆ وەك ئەوان جلیش لەبەر دەکەیت، و لۆمەشیان ناکەی بڵێیت ئەوان ئاوان و جلی ئەوانیش لەبەر ناکەم بۆیە تۆ بۆ ئەو کەسانە جل لەبەر ناکەیت تۆ بۆ بەجێ گەیاندنی شەرعی خوا تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ جل لەبەر دەکەیت و فەرمانێکی ئاسمانی جێ بە جێی دەکەیت. هەروەها ئەو کەسانەی داپۆشراون و گوناح و خراپە






دەکەن نابێ جلەکان پێوەر بێ بۆ ئەوان تا تۆ جلی شەرعی لەبەر نەکەیت ئەی بەندەی خوا ئایە نازانی هەموومان مرۆڤین و مروڤیش هەڵە دەکات. ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە :

(كل بني آدم خطاء، وخير الخطائين التوابون).(حسن- رواه الترمذي وابن ماجه والدارمي وأحمد).

**واتە:** هەموو نەوەی ئادەمیەك هەڵە دەكات و باشترینیان لە هەڵەکەی تەوبە دەکات.

ئەی نازانی کەس گوناحی کەس هەڵناگرێ فەرمایشێکی خوای پەروەردگار تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەهێنمەوە کە دەفەرمووێت: ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ٣٨﴾ (سُورَةُ النَّجْمِ:٣٨ ).

**واتە:** هیچ کەسێك گوناحی یەکێکی تر هەڵناگرێت.

منیش چەندین ئافرەتی سفورم بینیوە بەردەوام کاری خراپ دەکەن ئایە دەبێت منیش ئەو حوکمە بدەم بڵێم هەرچی ئافرەتی سفور هەیە خراپ و خراپکارن، بێگومان مرۆڤەکان بەدەستی خۆیانە چی ڕێگایەك هەڵدەبژێرن باشە خوشکەکەم تۆ ببە بە باڵاپۆش با باشترین ڕەوشتت هەبێ، باشترین کار و کردەوەی چاکت هەبێ و بیکەت، ئەگەر تۆ بێیت فەرمانێکی الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ببەستیتەوە بە بەندەیەك کە گوناحی لە ژێر ئەو فەرمانە کردوە ئەی کەوابێ نابێ






کەسمان هیچ فەرمانیکی الله ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ جێ بەجێ بکەین، بەڵام دەبێ ڕوونبێ لات ئەوەی الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ بۆت دەنێرێ نابێ بیخەیتە قاڵبی کردەوەی بەندەکانەوە، چونکە بەندە هەر بەردەوام تاوان دەکات. دەی گومانی ئەوانی وەك تۆ بیردەکەنەوە مەیهێڵە تۆ ببە بە حیجاب با باشترین ڕەوشتت هەبێ.

**گومانی چوارەم:** یان یەکێك لە بیانوەکانی ئەو خوشکانەی کە سفورن ئەوەیە کە دەڵێن: ببین بە بالاپۆش ئەوا کەس نیە زەواجمان لەگەڵدا بکات و پێمان ڕازی بێت.

پەنا بە الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ باشە کە تۆ هاتویتە ئەم ژیانەوە خوای پەروەردگار تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ هەموو شتەکانی ژیانتی لە **(لوح المحفوظ دا)** نەسیوەتەوە، سوێند بە الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ئەگەر سفور بیت یان بالاپۆش بێ خوای گەورە بۆی دیاری کردویت کە قسمەتی تۆ چۆن دەبێ، الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ کە پێغەمبەر نوحی عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ لە ناو لافاودا ڕزگارکرد، پێغەمبەر یونسی عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ لەناو سکی حودا ڕزگارکرد، پێغەمبەر ئبراهیمی عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ لە ناو ئاگردا ڕزگارکرد، پێغەمبەر ئیسماعیلی عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ لەسەربڕین ڕزگار کرد، پێغەمبەری خۆمانی صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە ئەشکەوتی حەڕا لەدەستی کافرەکانی قوڕەیش ڕزگارکرد، ئەی چۆن رەحم بە تۆ ناکات بەو بالاپۆشییەی کە خۆی لەسەرتی فەرزکردوە. با ئەم بیروباوەڕە لە دڵی تۆدا جێگیر بێ لەو ڕۆژەی کە خوای گەورە



ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ تۆی خستە سکی دایکت هەموو شتێکی بۆ دیاری کردویت، سوێند بە الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ هیچ هێزێك نیە نە لە دنیا نە لە قیامەت ئەوەی کە خوای پەروەردگار بۆی نووسبێتی هەڵی بوەشێنێتەوە ئەمە فێڵ و تەلەکەی شەیتان و نەفسە کە بە نەکردنی واجبێکی الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ تۆ نیعمەتێك لە نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار بەدەست بهێنیت.

**گومانی پێنجەم:** یان هەندێك لەو ئافرەتانە بیانوو دەهێننەوە کە تائێستا خوای گەورە هیدایەتی نەداوە ئەگەر خوای گەورە هیدایەتی بۆ نارد ئەو کات دەبێتە بالاپۆش.

دەی باشە ئەوە گەورەترین هیدایەت نیە کە خوای گەورە تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ تۆی کردوە بە موسڵمان، قورئانی بۆ ناردویت، پێغەمبەری صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ ناردویت و بە کەلامەکەی خۆی ئەمری پێ کردویت، تاوەك هیچ کەس لە رۆژی قیامەتدا بیانووی نەمێنێت کە هیچ بێدارکەرەوەیەکیان بۆ نەهاتووە لەلای الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ تاوەك فەرمانەکانی خۆی بۆیان بەیان بکات.

خوای گەورە تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت: ﴿

رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ ﴾

(سُورَةُ النِّسَاءِ: ١٦٥).

**واتە:** هەموو پێغەمبەران مژدەدەر و ترسێنەر بوون، تا دوای

ئەو پێغەمبەرانە خەڵکی هیچ بەڵگە و بیانوویەکیان نەمێنێ لە لای خوا، ئەگەر لار و لاسار بوون.

پاشان الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ لە ئایەتێکی تر دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ لَقَالُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴿١٣٤﴾﴾ (سُورَةُ طه: ١٣٤).

**واتە:** ئەگەر ئێمە بەر لەم قورئانە ئەوانمان بەسزایەك لە ناو بردبا، دەیانگوت: ئەی پەروەردگارمان! بۆچی لە دونیادا پەیامبەرێکت بۆ نەناردین تا پەیڕەوی بەرنامە و ئایەتەکانی تۆ بکەین بەر لەوەی ئەمڕۆ ئێمە ئاوا ریسوا و سەرشۆڕ و زەلیل ببین.

باشە کە تۆ هیچ هەنگاوێك نانێیت بەرەو الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ بڕویت، بەرەو جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ ، ئەی چۆن خوای گەورە بە زۆر هیدایەتت بۆ دەنێرێت ئەگەر خوای گەورە بە زۆر هیدایەتی مرۆڤەکانی بدایە بەرەو کاروکردوەی چاك، ئەوا هیدایەتی فرعەون هاوشێوەکانی فیرعەونی دەدا کە بانگەوازی خوایەتیان دەکرد خوای پەروەردگار ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ لە دونیادا مەشیئەتی داوەتە دەست ئینسانەکان بە ویستی خۆیان کام ڕێگایان دەوێت هەڵی بژێرن، بەڵام خوای گەورەیش هەموو ڕێگاکانی بۆ مرۆڤەکان ڕوون کردۆتەوە نەك ئەوەی زوڵم لە بەندەکانی بکات، نا بەڵکو بە ناردنی قورئان و پێغەمبەران کە مرۆڤەکان هیچ




بیانوویەکیان نەمێنێت، وە ئاگەداریانی  کردۆتەوە لە سەرئەنجامی هەر ڕێگایەك کە دەی گرنەبەر و ئەنجامەکەشیانی بۆ ڕوون کردۆتەوە، کە ئەویش پاداشتە بەبەهەشتەکەی و سزای تۆقێنەرە بە جەهەنمەکەی بۆ ئەو کەسانەی سەرپێچی بکەن.








# چەند ڕووداوێك لەسەر باڵاپۆشی

ڕووداوی یەکەم: پێغەمبەری الله ﷺ جەنگێکی گەورەی بەرپاکرد لەبەر ئافرەتێکی کە کەمێك جەستەی بەدەر کەوت ئەویش بەناوی جەنگی **(بەنو قینقاع)**، جولەکەی بەنو قینقاع کە لە مەدینە دەژیان بازاڕێکی ئاڵتونیان هەبوو، ڕۆژێکیان ئافرەتێکی موسڵمان چوو بۆ ئەو بازاڕە بۆ شت کڕین، جولەکەی پیس هەستا بەشی خوارەوەی کراسەکەی دا بەسەر سەرییەوە کاتێك ئافرەتەکە هەستا جەستەی بە دەرکەوت جولەکەکانی تر پێکەنین یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو جولەکەی کوشت، جولەکەکانیش سەحابەکەیان شەهید کرد پێغەمبەری خوا ﷺ کە بەمەی زانی سوپایەکی ڕێك خست و چووە سەر هۆزی بنو قینقاع لە شاری مەدینەدا گەماڕۆی دان و دەری کردن لەو شارە پەرتەوازەبوون و لە ناوچوون.

ئەم جەنگە گەورەی ئەنجامدا لە پێناو دەرکەوتنی لاشەی ئافرەتێکی موسڵمان ئەی گەر پێغەمبەری خوا ﷺ و سەحابە بەڕێزەکان بمانەیە و حاڵی موسڵمانان و ئافرەتانی ئەمڕۆیان






ببینیایه دوای هەموو ئەو قوربانیانەی کە لە پێناوی ئیسلام و حوکمەکانی ئیسلام دایان ئەبێ چەندە خەفەت باربوونایە.

ئەی خوشکەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا چۆن ڕووت دێت سەیریان بکەی ئەوان ئاوا قوربانیان دا تۆیش ئاوا بە ئاسانی خۆت ڕووت دەکەیتەوە و شانازی پێوە دەکەیت و فەرمانی رب العالمین دەشکێنیت.

ڕووداوی دووەم: پیاوێك باسی خێزانی دەکات دەڵێت: خێزانم هاوڕێیەکی هەبوو زۆر سفور بوو خێزانم کەسێکی لە خواترس بوو بەڵام هاوڕێکەی بەردەوام لەسەر مۆدە ئەڕۆی ڕۆژێکیان بە خێزانمی وت جلی جوان هاتۆتە بازار با بڕۆین بکڕین، خێزانیشم وتی بەمەرجێك ئەڕۆین دەبێ سەرتا لەگەڵمدا بێت سەردانی شوێنێك بکەین، وتی باشە. بەڕاستی ئەوەیە هاوڕێ دڵسۆز چەندە لە خەمی ئەو هاوڕێ سفورەی بوو، بردی بۆ شوێنێك کە مامۆستایەك لەوێ وتاری دەدا قەدری الله ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ئەو وتاریەیش باسی تۆبە و پەشیمانی بوو، گەڕانەوە بوو بۆ لای خوای گەورە ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ، ئەو ئافرەتە سفورە بەو وتارە زۆر کاریگەر بوو لە کۆتای وتارەکە زۆر گریا تاکە وشەی ئەوە بوو دەیوت: **خوایە گەڕامەوە بۆ لای تۆم حیجابم لەبەر بکەن** پێیان وت با بگەڕێنەوە ئەو کات حیجاب لەبەر بکە بەڵام ڕازی نەبوو هەتا بۆیان هێنا کاتێك لەو شوێنە دەرچوو بەو جلەی کە الله






ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ﷻ لە حەوت تەبەقەی ئاسمان فەرمانی فەرزبوونی داوە سبحانە اللە کە لەو شوێنە دەرچوو سەیارەك لێدا و وەفاتی کرد.

ئەی بەندەی خوا بۆ ئەوەندە دڵ ڕەقی هەتا کەی بە خۆشی و لە زەتەکانی دونیا ئەخەڵەتێت هەتا کەی لە پەروەردگاری جیهانیان دوور دەکەویتەوە هەتا کەی؟؟؟.

ئەی خوشکەکەم ڕەنگە بڵێیت من هێشتا تەمەنێکی زۆرم ماوە حیجاب بپۆشم هێشتا سەرەتای گەنجیمە سەیری ئەو ئافرەتە بکە ئەو بەسە بۆ دەرس وەرگرتن، ئەو هەر چەندە تۆبەی کرد نەی وت با بگەرێمەوە ئەوکات حیجاب دەپۆشم دەیزانی کە شەڕی نەفس و شەیتان چەندە گەورەیە، کە بڕۆشتایەتە ماڵەوە وەسوەسەی تری بۆ درووست بوایە پەشیمان بوایەتەوە لە بەجێ گەیاندنی فەرمانی اللە ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ﷻ، بڕیاری دا هەر لەو شوێنە فەرمانی خوای پەروەردگار بەجێ بهێنێت، دەیزانی ئەگەر هەر هەنگاوێك بنێت توشی گوناحی زیاتر دەبوو وە گەنجانیشی وەك خۆی توشی گوناح دەکرد وە دەیزانی ئەگەر پەلە نەکات لە بڕیارەکەی دوای شتێك هەیە ڕێگری لێ بکات لە بڕیارەکەی ئەویش مردنە، ببینن چەندە خێرا مردن بۆی هات.

تۆیش ئەی خوشکەکەم دەڵێیت: هێشتا تەمەن ماوە با تەمەنی گەنجیم بەسەر بەرم کە پیر بوو ئەو کات دەبم بە بالاپۆش، باشە






تۆ نامەیەکت بۆ هاتووە لە لای اللە ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ کە تەمەنی تۆ هەتا پیر بوون دەڕوات، ئەی پێغەمبەر ﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ نا فەرموویێت: (ولا تدري نفس بأي أرض تموت إلا الله) (رواه البخاري: ٧٣٧٩).

**واتە:** هیچ نەفسێك نازانێ لەچ شوێنێکدا دەمرێت (وە کەی دەمرێت).

ڕووداوی سێیەم: بە سەرهاتێکی تر دەخەینە ڕوو ئەویش لە ڕووداوێکی تر کە لە شاری غەزا لە فەلستین ڕووی داوە، دەگێڕنەوە و دەڵێن کچێکی سفور هەبوو بە ڕادەیەك ڕێزی لە هیچ شوێنێك و کاتێکی ئیسلام نە دەگرت تەنانەت لە مانگی ڕەمەزانیشدا خۆی دانە ئەپۆشی و خۆی دەڕازاندەوە بە جلی نا شەرعی و جەستە و لەش و لاری دەردەخست بە شێوەیەك جێگای سەرنج بوو ڕۆژێك ئەو کچە سەر ئوتۆمبێلێك دەکەوێت بە شێوەیەك خۆی ڕازاندبووە کاریگەری لەسەر شوفێرەکە درووست کرد بوو شوفێرەکەیش کەسێکی لە خوا ترس بوو پێ دەڵێت: خوشکم لە خوا بترسە بەم مانگە پیرۆزە خۆت بەو شێوەیە ڕازاندۆتەوە، زۆر ئامۆژگاری دەکات بەڵام ئەگەر دڵێك ڕووناکی اللەی ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ تێدانەبێ هەرگیز هیچ ئامۆژگاریەك وەرناگرێت، وەك اللە ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ لە قورئانە پیرۆزەکیدا دەفەرموویێت: ﴿لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا






﴿وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ﴾ (سُورَةُ الأَعْرَافِ :١٧٩).

**واته:** دڵیان هەیە کەچی هەق وەرناگرن و تێ ناگەن لە هەق، چاویان هەیە کەچی دەسەڵاتی اللەی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی هەقی پێ نابیستن، ئەوان وەك ئاژەڵ وان بەڵکو لە ئاژەڵ وێڵترن.

کچەکەیش موبایلێکی بەدەستەوە بوو بە شوفێرەکەی وت: ها ئەوە موبایلەکەمە تەلەفۆن بۆ خوا بکە تا شوێنێك لە دۆزەخ بۆ من و شوێنێك لە بەهەشت بۆ تۆ دابنێ. (پەنا بە اللە ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ سەیری ئەو دڵ ڕەقە بکە ئەی ئینسان بۆ ئەوەندە دڵ ڕەقی لە ئاست خالقەکەت لە ئاسات ئەو زاتەی کە هەناسەیەك بێ ئەو ناتوانی بدەی ). بەڵام چی ڕوویدا اللە تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ هەر لەو شوێنەدا وەڵامی دایەوە ڕووحی کێشا و مرد کۆتای بە تەمەنی هات، ئای چی سەرئەنجامێکی پر لە ئازارە شوفێری تەکسیەکە بەخێرای دەی بات بۆ نەخۆشخانە کە دکتۆرەکان دێنە سەری دەڵێن: مردووە، پاشان دەیخەنە ناو بەفرگرەوە هەتاوەك کەسوکارەکەی دێن ئەچن سەیری دەکەن بەڵام چی دەبینن؟ دەبین کچەکەیان دەم و چاوی ڕەش بووە موبایلەکەی بەدەستەوەیە، بەدەستی نوساوە هەرچەند هەوڵیاندا بۆیان لێ نەکراوەیە بێگومان هیچ هێزێك ناتوانی لێ بکاتەو ئەوە فەرمانی اللە تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ کە ئەو موبایلە ببێتە بەڵگە





و حوجەیەك لەسەری لە ڕۆژی قیامەدا، وەك رسول الله ﷺ دەفەرموویت: **(هەر كەسێك لەسەر چی حاڵەتێك بمرێت، بەوەیش زیندوو دەكرێتەوە)** دەی خوشكەكەم پەلەبكە كاتەكان كەمە هەناسەكان كورتە خوشیەكان دەڕۆن و لەزەتیان نامێنێ، گەشتێكی درێژمان لە پێشە، حسباێكی سەختمان لە پێشە، ورد و دڕشتی شتەكانمان لێ دەپرسرێتەوە، پەلەكە هەر ئەمڕۆ هەر ئەم دەقە بڕیاری بالاپۆشی بدە، واللەی هیچ خۆشی و لەزەتێك نیە لەسەر ئەم زەوییە مەگەر لە گوێڕایەڵی الله دا هەبێ، وەك الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرموویت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾﴾ (سُورَةُ النَّحْلِ :٩٧).

**واتە:** هەر پیاو و ئافرەتێكی ئیماندار، وەڵامی داواكاری خوا و پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە و كردەوەی چاك بكەن ئەوە ئێمە (واتە الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ) دەیژیەنین ژیانێكی باش وچاك وپاك، وە پاداشتیشی دەدەینەوە بەگوێرەی چاكترینی كردەوەكانی.

الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ هیچ شتێكی لەسەر ئێمە واجب نەكردوە ئیلا حیكمەت و خوشی لە زەتێكی بۆ ئێمە تێدایە.



ڕووداوی چـوارەم: مــردوو شۆرێك لە یەكێك لە وڵاتە عەربیەكان باسی ئەم ڕووداوەمان بۆ دەكات، لەو وڵاتە عادەت وایە كە مردوو شۆری تایبەتیان هەیە، ئەم مردوو شۆرە دەڵێت: ڕۆژێكیان تەلەفۆنێكیان بۆ كردم كە مردوویەكیان هەیە بۆیان بشۆمەوە، دوای ئــەوەی كە چـوم بـــۆ مـــاڵەكە خاون ماڵەكە پێ وتم: مردووەكەمان لەو ژوورەدایە منیش چوم تـاوەكو مردووەكەیان بۆ بشۆمەوە كە چومـە ژوورەوە خاوەن ماڵەكە یەكسەر دەرگایـان لەسەرم كلیل دا زۆر ترسام هەر چەندە دەم دا لە دەرگا تاوەكو دەرگاكەم بۆ بكەنەوە خاوەن ماڵەكە وتی تائێستا چەندین مردوو شۆرمان هێناوە تاوەكو مـردووەكەمان بۆ بشۆنەوە كە سەیری مردووەكەیان كردووە نەیان توانیەوە بیشۆنەوە تۆ دەبێ هەر بۆمان بشۆیتەوە، وتی منیش بە ترسێكی زۆر سەر دەم و چاوی مردووەكەم لابرد چی ببینم!!، مردووەكە ئافرەتێك بوو هەموو دەم و چاوی ڕەش بوو بوو كە دەستم لە گۆشتەكەی دەدا بەدەستمەوە هەڵدەوەری، منیش بەترسێكی زۆرەوە بە پەلە شۆردمەوە بە خێرای گەرامە ماڵەوە، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ خەوم لێ نەكەوت هەر بیرم لەو مردوە دەكردەوە دوای تەواو بوونی پرسەی ئەو كچە كە مردبوو ڕۆیشتم بۆ ماڵەكە تاوەك لە حاڵی ئەو مردووەیان ببپرسم هۆكاری چیە كە خوای گەورە لە دنیادا ئاقیبەتی

ئەو کچەی دەرخست کە چۆن گەڕایەوە بۆ لای خۆی، پرسیارم کرد لە کەس و کاری، ئەوانیش وتیان: ئەم کچەی ئێمە کەسێکی زۆر سفور بوو، نوێژی نەئەکرد، کام جل و بەرگ خوای گەورە پێ ناخۆش بووایە لەبەری ئەکرد ئەمەیش ئەنجامەکەی بوو.

پەنا بە الله ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ لەو ئاقیبەت شەرییە، ئەی خوشکی بالانەپۆش تۆ هەموو خوشی و لەزەتی گوناحت بەسەر برد دەی یەك جاریش فەرمانەکەی الله ﷻ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ بەجێ بهێنە بزانە لەزەت و خۆشی کامیان زیاترە، کەمیان بوژانەوەی دڵە، کامیان ئاسودەی و ئارامی دڵە.









لەکۆتایدا پێت دەڵێم: ئەی بەندەی خوا ئایە کـــاتی ئەوە نەهاتووە کە تەوبە بکەیت و پێداچونەوەیەك بکەیت لەسەر خۆت؟.

ئایە کاتی ئەوە نەهاتووە کـــە ملکەچی فەرمانەکانی الله ﴿تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ﴾ بیت بەڕوونکردنەوەی ئەو بەڵگانەی پێمان دایت ؟.

داواکارم لە پەروەردگاری جیهانیان  کە هەمووومان بپارێزێت بەم ئیسلامە و بەم دینە و بەم یاسا و ڕێسا پاکەی، بمانخاتە ژێر ڕەحمەتی خۆیەوە بەم ئیسلامە جوانە و پەردەی حەیا و حشمەت و سەنگینیمان لەسەر بەردەوام بکـــات بمانکاتە پاکترین ئافرەتانی زەوی و بەدوورمان بکات لە فێڵ و تەڵەکەی شیطان و یارمەتی خوشکانی سفورمان بات کە خۆیان بکەنە ژێر فەرمانەکانی خۆی ئەو لەزەتەیان پێ ببەخشێت کە خوشکانی بالاپۆش هەستی پی دەکەن، وە یارمەتی خوشکانی بالاپۆشیشمان بدات بەردەوام بن لەسەر ئەو ڕێگاییەی کە گرتوویانەتە بەر ..

وآخر دعواهم أن ٱلحمد لله رب ٱلعالمين

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه وسلم**





# ناوەڕۆك



